زنجیرەیەك بۆ یەك خواپەرستان : (١)

# لا اله الا اللّه

## ماناکەی . پایەکانی
## مەرجەکانی . دژەکانی

نووسینی

الیاس محمد الکردی

چاپی دووەم - ١٤٢٣کۆچی



زنجیرەیەک بۆ یەک خوا پەرستان: ( ١ )

# لا اله الا الله

## مانـاکـەی . پـایـەکـانی

## مـەرجـەکـانی . دژەکـــانی

نووسینی

الياس محمد الكردي

چاپی یەکەم ـ ( ١٤٢١ ) کۆچی

بسم الله الرحمن الرحيم

---


- ناوی زنجیره: زنجیرەیەك بۆ یەك خوا پەرستان ـ (١)
- نـــاوی نامیلکـــه : (لاإلـــهإلا الله) ، ماناکـــەی ، پایـــەکانی ، مەرجەکانی ، دژەکانی .
- نووسینی : إلیاس بن محمد الکردي .
- تیراژ : ( ٥٠٠ ) دانه .
- چاپی یەکەم ـ ١٤٢١ کۆچی .

# پێشەکی

الحمدلله الذي لاإله إلاهو الرحمن الرحيم ، رب السموات والأرض و مابينهما لاشريك له ولم يتخذ صاحبة ولا ولدا ، ليس كمثله شيء وهو السميع البصير .

و الصلاة و السلام على إمام الأنبياء و المرسلين و قائد المجاهدين ، الذي دعى الناس إلى كلمة التوحيد لاإله إلاالله ، من الحظة التي بورك بالوحي الالاهي حتى لقي القدر الذي نهاية كل مخلوق . والذي قال : (( من قال لااله الاالله . وكفر بما يعبد من دونه. حرم ماله ودمه وحسابه على الله )) . [1]

اما بعد :

سوپاس بۆ خوای پەروەردگار کە لەدوای ئیزنی ئەو توانیمان ئەم زنجیرەیە ئامادە بکەین .

لە ڕۆژگارێکی وەك ئەمڕۆ موسڵمانان بەشێوەیەکی گشتی . زۆربێ ئاگان لە عەقیدەو بنچینەی ئیمانەکەیان ئەوشتانەی کە واجبە لەسەر هەموو کەسێك کەدێتە ناو ئیسلام . دەبێ بیزانێ ، وەك مەرجەکانی (لااله الاالله) و مەرجەکانی دروستی ئیمان و

---

(١) رواه مسلم .

دژەكــانی و هەڵوەشــێنەرەكانی ، زۆربــەی موســـوڵمانان لێ ی بێئاگان . یـان ئـەوەتا بـیرو بۆچوونـی گومـڕاو ناتـەواویان هەیـە زۆر لەموسـڵمانان بـیرو بـۆ چوونـە گومڕاكـانی مورجیئـەیان بـۆ دروست بـووە . خـەڵكانێكیش بەنەزانینـەوە بـاس لـەم بابەتانـە دەكەن و لێكی ئەدەنەوە .

سـەیری دەكـەی ئەوپـەڕی گرینگـی ئـەدەن بەشـتە بچووك فەرعیەكان . هەندێكیان خۆیان بە تـەجوید و سـروود و گۆرانـی و فیكرو سیاسەت خەریك كردووە هەندێكیشیان گرینگـی ئـەدەن بەهــەندێ لەشــتە حەرامــەكان وەك ڕیــش تاشــین و مۆســـیقا و فەسـادەوە . وائــەزانن دیـن هــەر ئەوەیــە هــەندێكیش گرینگـی بەلایەنی ڕێخستنی حزبایەتی ئەدەن بەڵام ئەگەر پێیان بووترێ مەرجەكانی (لاالەالاالله) چییە یان پێیان بووترێ ئـەو كردەوانـە چین ئـەنجام دانـی ئیمــان هەڵدەوەشــێنەوە یــان مــرۆڤ بــەچی هەڵدەگەڕێتـەوە لەئیسلام یـان حەقیقـەتی ئیمـان چییـە لـەلای اهل السنة والجماعة وكفـر چییـە و چـەند جۆرەو چـەند بەشـە یان (مراتب الایمان) چییــە و چـەندە یـان خانـەكوفـر كامەیـە و خانەی ئیسلام كامەیە یان مرتد كێیـە و كـافری ئـەصلی كێیـەو حوكمیـان چۆنـە؟ والله زۆربـەیان نــایزانن بۆیــەش ئەمــە حــاڵی موسڵمانانی ئەمڕۆیە هەموو زەلیلی و ژێر دەست و بێ كیانن .

كوفر و شرك ئـەنجام ئـەدەن و هـە ستیشی پـێ ناكـەن جا كـاتێكیش پێیـان بڵـێ ی ئەمـە كوفـرە ، شـركە ، دووركـەوە لێ ی بــەناموو شــێت و تونــدڕەو ســەیرت دەكـــەن . كۆمـــەڵێكیش لەموسڵمانان هەربە ئەنقست بیرو بۆچوونە گومـڕاو بۆگەنـەكانی مورجئـەو جەهمیـەكان لەسـەر ئـەم مەسـەلانە بڵاو دەكەنـــەوەو لافـی شـوێنكەوتنی سـەلەفی صالحیشـی پـێ لێ ئـەدەن نـازانین لەحیسابی كێ ئـەم كـارە ئەكـەن بـۆ هـەموو ئـەم هۆكارانـە و گـەیاندنی عەقیدیـەكی تـەواو و ڕاسـتەقینە و عـەقیدەی ئەهلی السنە و الجماعة نەك بیرو بۆ چوونی بەچكە مورجئـەكانی ئـەم سـەردەمە . وە بـۆ لـەناو بردنـی بـیرو بۆچوونـی مورجئــەكان و ڕیسواكردنی ، بیرمـان لـە ئامـادە كردنـی زنجیرەیـەك لەنامیلكــە كـرد دەربـارەی بـیرو بـاوەڕی ڕاسـتەقینەی سـەلەفی صـالح بـۆ هـەموو خواپەرسـتێك و حـەق ویسـتێك و دژبــە هـەموو كـافرو مورتـەدێك و ئـەو مورجئانـەی شمشێری كافران لەسەر موسڵمانان تیژتـر دەكەن جا بۆ ئەم مەبەستە كرینگ ترین شت و چاكترین شـت مەرجـەكانی ووشـەی (لاالـە الاالله) یـە . ئـەو وو شـــەیەی كەهەر هەموو پێغەمبەران لـەئادەم تـا خاتـەم بـۆ گـەیاندنی ئـەو ووشـەیە بۆخـەڵكی نـێردراون وە ئەساسـی هـەموو ئـایینێك و شـەریعەتێكی خواییـە . بەپشـتیوانی خـوا لـەم بەشـــە . بـــاس

لەماناى (لااله الاالله) دەكەين و باس لە بە شەكانى و پايەكانى و مەرجەكاىٔ قبولٔ بوونى دەكەين لەگەڵ ئەو كارو گوفتارانەى دژن بەم ووشەيە بەگوێرەى بيرو باوەڕى اهل السنةْ والجماعةْ بەپشتگيرى بەڵگە ڕاست و دروستەكانى قورئانى پيرۆزو سوننەتى پاكى پێغەمبەر (ﷺ) وەفتواو ووتەى شارەزايان و زانايانى اهل السنةْ. جا داواكارم لەخوداى پەروەردگار بەڕەحم و لوطفى خۆى يارمەتيمان بدات بۆ سەرخستنى ئەم كارەمان و هەموو كارێكى خێرمان . وە بمانكات لەو كەسانەى بۆ بەرز كردنەوەى ئەم ووشەيەلەسەر دڵى كافران و مرتدەكان تێكۆشاون و پلەى شەهادەتيان بەدەست هێناوە .

اللهم اجعل اخر كلامنا في الدنيا قول (لااله‌الاالله) اللهم احشرنا
مع رافع لواء الموحدين محمد بن عبدالله الامين
وصلي اللهم عليه وآله وصحبه والموحدين اجمعين

بە پێنوسى
الياس بن محمد الكردى
١٤٢٠ من الهجرة

## يەكەم:

# مانا و مەبەست لەووشەی

# (( لااله الاالله ))

لەوكاتەوەی قەومەكەی نوح (عليه السلام) دە ستيان كرد بەبت پەرستی . خودای پەروەردگار پێغەمبەرانی ڕەوانەكرد بۆ ميللەت و گەلەكان . تا دووريان بخەنەوەو ئاگاداريان بكەنەوە لەم كارە بەد و ناشيرينە . هەر لە (نوح)ەوە هەتا هود و ساڵح و ابراهيم و لوط و اسماعيل و اسحاق و موسی وعيسی هەتا دوا پێغەمبەر لەسەر ڕووی زەوی محمد .[علی نبينا وعليهم صلوات الله وسلامه] .

هەر هەمووشيان بۆ يەك مەبەست نێردرابوون و داوای يەك شتيان دەكرد . كە ئەويش پەرستنی خودای گەورەيە بەتاك و تەنهايی بەبێ هاوەڵ بڕياردان بۆی لەهيچ شتێك و لەهيچ كەسێك كە هەموو ئەم مەبەستانەيان كۆكردبۆيەوەو كورتيان كرد بۆيەوە لە ووشە (لاالەالاالله) . هەموو هەوڵێكيان بۆ جێ بەجێ كردن و چەسپاندنی ئەم ووشەيە بوو لەسەر ڕووی زەوی جا هەر كەسێك دانی بەم ووشەيەدا بنابووايە . واتە

بـەتاك و تەنـهایی خـودای بپەرسـتایەو خـۆی بـەری بکردایـە لەهـەموو خوایـە ناحەقـەکانیـتر . ئـەوا ئـەبوو بەشـوێنەکەوتەی پێغەمبەران .

حا بـەم شـێوە مانـای (لاالـەالاالله) .. واتـە : هیـچ خودایـەك بەحەق نـیـە لەزەوی و ئاسمان جگەلە الله . کەس و هیـچ شـتێك مـافی خوایـەتی نـیـە تەنـها خـاوەنی هـەموو گـەردوون و دروستکاری هـەموو گـەردوون و بەڕێوەبـەری هـەموو گـەردوون . کە خودای تبارك و تعالیـە

هیچ کەسێك و هیچ شتێك حەقی ئەوەی نـیـە هەرشتێك ناوی پەرستن بێت بۆی ئەنجام بدرێت تەنها خودای گەورە نـەبێ کە شایستەی هەموو پەر ستنێکە .

## دووەم :

# پایەکانی یاخود بەشەکانی
# (( لااله الاالله ))

ووشـەی (لاالـە الاالله) . لەدووبــەش پێكـهاتووە . یـاخود لەسەر دووپایە ڕاگیر كراوە :

١- نـەفی كردن : النفي

٢- ئیسپات كردن : الاثبات

كاتێك دەووترێ (( لااله )) واتە : هیـچ كـەس و هیـچ شتێك مـافی خوایـەتی نـیـە . ئەمــەش نـەفی كردنــە . نـەفی كردنـی هەموو خوا ناحەقەكان .

وە كـاتێك دەووتـرێ (( الا الله )) واتـە : تەنــها الله شایسـتەی پەرستنە و مـافی خوایـەتی هەیـە ئەمـەش سـەلماندن و ئیسـپات كردنی خوایەتی‌یە بەتاك و تەنهایی بۆ پەروەردگاری هەموو جیهان .

بـەم شـێوەیە ووشـەی لاالـە الاالله لەســەر ئـەم دووپایـەی جێگیر كـراوە . جا ئەگـەر یـەك پایــە لـەم دووپایــە جێبـەجێ نـەكرێت ئـەوا (لاالــە الاالله) یەكـە دانامــەزرێت و خاوەنەكەشـی نابێ بە یەكخوا پەرست .

وەك خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿فمن يكفر بالطاغوت ، ويؤمن بالله . فقد استمسك بالعروة الوثقى﴾ . (البقرة :٢٥٦)

واتە ، هەرکەسێ ، تاغووتان و خودا ناحەقەکان بەکافر بزانی و بەڕاستیان نەزانێ ، وە ئیمان بەخودا بهێنێت بەتاك و تەنهایی ، ئەوا بەڕاستی دەستی گرتووە بەپەتە بەهێزەکە و لەموەحیدانە . ئەم پەتەش ووشەی (لاالەالاالله) یە کەواتە ئەوەی خوای گەورە ووشەی (لاالەالاالله) وەربگرێ و خاوەنەکەی لە ئەهلی (لاالەالاالله) قبولْ بکات دەبێ کوفر بکات بە طاغووت وە ئیمان بهێنێ بەخوا وە مەنطوقی ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ . ئەگەر کەسێك نەفی خوایەتی ئەوکەسانە نەکات کە خۆیان دەهێننە ڕیز خودای گەورە و ئیمان بهێنێت بەخوا . یان نەفی مافی خوایەتی خواناحەقەکان بکات بەدڵ و زارو کردەوە . ،

بەڵام ئیمان بەتاك و تەنهایی خودا نەهێنێت ئەوا با ملیار جار بڵێت (لاالەالاالله) لێ ی وەرناگیرێ .

سێیەم:

# مەرجەکانی ((لاالە الاالله))

ووتنی (لاالـە الاالله) هـەر بـەزار بەس نـیـە بـۆ وەرگیرانی ئەم ووشەیە لەخاوەنەکەی لـەلای خـودای پـەروەردگار یان هەر بەدڵ باوەڕی پـێی هـەبێ و قەناعـەتی پێی هـەبێ یـان بەکردەوە ئەنجامی بدات و بەدڵ و زاریش هیچ بەڵکو دەبێ ئـەو مەرجانـە جێبـەجێ بکرێـت کـە ڕاسـتی و دروسـتی لاالـە الاالله جێگیر دەکـەن.جارێکیان پرسیاریان لـەوەهب کوڕی منبـە (رضي الله عنه) کرد ووتیان: کلیلی دەرگای بەهەشت چییە؟ فـەرمووی: ووتنـی (لاالـەالاالله) یــە ووتیـان کەواتـە هەرکەسـێ بڵێـت (لاالــەالاالله) دەچێتە بەهە شت. فەرمووی: بەڵام هەموو کلیلێك دانی هەیـە دانـی (لاالـە الاالله)ش، مەرجەکانیـەتی. تا ئەو مەرجانەی جێبـەجێ نەکەن لێتان وەرناگیرێ.

جـا چـەندان فــەرموودە هــاتووە لەســەر (لاالــە الاالله). هـەندێکی دەفـەرمووێ هەرکەسـێ بـەزمان دەری بـبڕێ دەچێتـە بەهەشت وە لەهەندێکی تری دەفـەرمووێ هەرکەسێ بەدڵسۆزی دەری ببڕێ دەچێتە بەهەشت. لەهەندێکیتر دەفەرمووێ ئەوەی دەریبڕێ و کوفر بکـات بـەطاغووت ئـەوا دەچێتـە بەهەشت. جا

بـۆ ئـەوەی ئێمـــە زوڵـــم لەمەســـەلەکە نەکــەین . هـــەموو فـەرموودەکان لێـك دەدەیـن ئەوانـەی لەسـەر ووشـەی (لاالـەالاالله) هـاتووە . نـەوەك هـەندێکی وەربگریـن و هـەندێکی تریشـی پشـت گوێ بخەین .

## مەرجی یەکەم

## زانینی ماناکەی (العلم بمعناها)

واتـە بزانـی لاالـە الاالله مانـــای چییـە و چـی دەگەیـەنێ . زانینێکی ڕاستەقینە . خوای گەورد دەفەرمووێ : ﴿فاعلم انه لااله الاالله﴾ (محمد :١٩)

واتە : باش بزانە کە هیـچ خوایـەك نییـە بەحـەق بێجگـە لە (( الله )) .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ((من مات وهـــو يعلم انه لااله الاالله ، دخل الجنة)) .

واتـە : هـەر کەسێ بمرێـت و دەیزانـی کـەوا هیـچ خوایـەك نییە بەحەق جگەلە (الله) . ئەوا دەچێتە بەهەشت .

ناوەڕۆکی فەموودەکە ئەوە دەگەیەنێ . هەرکەسێ بمرێت و نەزانێ مانای (لااله الاالله) چییـە . ئـەوا ناچێتـە بەهـە شت . چونکە گەر یەکێك عیلمی بەشتێك نـەبێ بێگومـان بـاوڕی پـێ

نابێ . هەرکەسێکیش باوەڕی بە (لاالـه الاالله) نـەبێ . ئـەوا بـەبێ گومان کافرەبابەداخـەوە لـەم سـەردەمە لـەنێو موسـڵمانان چـەند زورە نمونــەی ئەوکەســانەی دەڵێــن (لاالــه الاالله).هەیــە زاری بـەردەوام بـەم زیکـرە دەجوڵێ . بـەڵام سـەیر دەکـەی یـەکێکی‌تر دەپەرستێت ئەوەش بەهاوار کردنی بۆ غەیری خـودا یـان لەسـەر ڕێبازی غـەیری ئیسلام کار دەکـات و لایـەن گـری دەکـات یـان گوێڕایـەڵی کـافر دەکـات و خۆشــیانی دەوێــت ئــەم کارانــەش بەلایـەوە ئاسـاییە . هەرچـەندە ئـەم کارانــە (لاالــه الاالله) لــە بناغـەوە هەڵدەوەشێنینەوە . بـەڵام لەبـەر ئـەوەی نازانـێ مانــای ڕاستەقینەی (لااله الاالله) چیـیە و چی دەگرێتـەوە وەك محمـدی کوڕی عبدالوهاب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێ : (هەیانـە وادەزانێت کـەوا مانـای (لاالـه الاالله) واتـە تەنـها خـوا ڕۆزی دەرەو تەنها خوا دروست کارە یان لـەم بابەتانـە)[٢] ئـەنجامی ئـەدات زۆر بەلاشیەوە ئاساییە .

---

(٢) لەزنجیرەکانی داهاتوو انشاء الله باس لەوە دەکەین کـە نـەزانین (الجهل) چیـیەو چۆنـەو چـەند بەشەو کێ عوزرو بیانوری هەیە لەوەی نەزانە .

## مەرجی دووەم

## دەربڕینی بەزمان (النطق بها باللسان)

پاش زانینی ماناكەی . دەبێ بەزمان بیڵێت و دانی پیادابنێت . چونكە (لااله الاالله) لەكەس وەرناگیرێ هەتا بەزمان شاهدی لااله الاالله محمد رسول الله دەرنەبڕێت . بەڵگەش لەسەر ئەمە فەرموودەكەی پێغەمبەرە (ﷺ) كە دەفەرمویٚ : (( امرت ان اقاتل الناس حتى يشهدوا ان لااله الاالله وان محمداً رسول الله )). [٢]

: واتە : فەرمانم پێدراوە شەڕو كوشتار لەگەڵ خەڵكی بكەم تا شەهادە دەهێنن بە (لااله الاالله وان محمدا رسول الله) ئیمامی (النووی) دەفەرمویٚ : (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە یەكێ لەمەر جەكانی قبووڵ بوونی ئیمان ئەوەیە بەزمان شەهادە بهێنێت و دڵ و باوەڕی پێ بكات وە باوەڕ بەهەموو ئەوشتانەی كەوا پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی . [٤]

---

(٢) رواه البخاری و مسلم

(٤) شرح صحيح مسلم (١ / ٢١٣) .

هەروەها ابن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێ : (شایەتمان ئەگەر هەرکەسێ بەزمان دەری نەبڕی . لەگەڵ ئەوەی هیچ ڕێگریێکیشی لەبەردەم دا نەبوو . وەك لاڵی ، ئەوا کافرە لەلای موسڵمانان بەبێ جیاوازی . هەروەها کافرە لەدونیاو قیامەت . لەلای . لەلای سەلەف و ئیمامی مەزهەبەکان و زانایان).

## مەرجی سێ هەم

## کوفر کردن بەطاغوت ( الکفر بالطاغوت )

واتە : خۆ بەری کردن لەکافرەکان و تاغووتان و خواناحەقەکان و بەکافر زانینیان و بەڕاست نەزانینیان و دژایەتی کردنیان و پەیدا کردنی ڕق و قین بەرامبەریان . هەموو ئەمانە بەدڵ و زمان و کردار ئەنجام بدرێن .

خوای گەورە لەم ئایەتە ئەم مەرجەی مەبەستە ﴿فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى﴾ (البقرە :٢٥٦)

واتـە : هەرکەسێ خـۆی بـەری کـرد لـەتاغووتان و ئیمـانی هێنا بەخوا ئەوا بەڕاستی دەستی بەپەتە بەهێزەکە گرتـووە کـە ئەویش (لااله الاالله)یە

دەقی ئایەکە ئەوە دەگەیەنێ . ئەگەر یەکێ ئیمانی بـەخوا هێنا بەڵام خۆی بەری نـەکر لـەخوا ناحەقـەکان ، ئـەوا ئیمـاندار نیـیـە و شـایـەتمانی (لاالـه الاالله محمـد رسـول الله)ی نـەهێناوە جـا ئەمە لەم فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بەڕوونی بەدەر دەکـەوێت کە دەفەرموێ : (( مـن قـال لاالـه الاالله وکفـر بمـا یعبـد مـن دونـه حرم ماله ودمه وحسابه علی الله )) . [٥]

واتە : هەر کەسێ بڵێت لاالـه الاالله وە کوفـر بکـات بـەوەی لەغەیری خودا دەپەرسترێ . ئـەوا مـاڵ و خوێنـی پـارێزراوە . وە خـوای گـەورە حیسابی لەگـەڵ دەکـات لـەڕۆژی دوایـی . ئایـا ئـەم شایەتیەی لەدڵەوە بووە . یان هەربەنیفاقەوە ووتوویەتی .

شێخی ئیسلام محمدی کوڕی عبدالوهاب (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێت) لەشی کردنەوەی ئەم فەرموودە یە دەفەرموێ : (کەواتـە ئەگـەر یـەکێك ئیمـان بـەخوا بـهێنێت بـەڵام کوفـر نـەکات بەتاغووت . ئەوا ماڵ و خوێنی ناپارێزێت و حەڵاڵە) . [٦]

---

(٥) رواه مسلم .

(٦) مجموعه التوحید (٢٥١) .

بەڵام كوفر كردن بەتاغووت . هەر بەزمان نابێ یاخود هەر بەدڵ بەڵكو دەبێ بەدڵ تاغووتان و كافران بەناحەق بزانی و خۆت لێیان بەری بكەیت و ڕق و قین و دژایەتی دروست بكەی بەرامبەریان . ئینجا دەرخستنی ئەمە بەزمان ئینجا سەلماندنی ڕاستی ئەم هەڵوێستە بەكردەوە چونكە چۆن ئیمان هێنان بەدڵ و زمان و كردەوە دروست دەبێ . ئاواش دەبێ كوفر بەتاغووت بكرێت .

جا كاتێك دەڵێین كوفر بە تاغووت .

دەبێ بەچەند شێوەیەك ئەنجام ئەدرێت .

بە بەكافر زانینیان و ناڕاست زانینیان و ناڕازی بوون پێیان

* بەخۆ لێ بەری كردنیان و خۆ لێ دوور خستنەوەیان .
* بەدژایەتی كردنیان و بەر بەرەكی كردنیان
* بە ڕق و قین پەیدا كردن لەبەرامبەریان
* توندو تیژی و دڵ ڕەقی نواندن لەدژیان

ئەمانەش بەگشتی لەم ئایەتەدا بەدەر دەكەوێ . كە خوای گەورە باسی ابراهیم (عليه السلام) و شوێن كەوتووانی دەكات كە چ هەڵوێستێكیان نواند بەرامبەر قەومەكەیان . خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿قد كان لكم اسوة حسنة في ابراهيم والذين امنوا معه اذ قالوا لقومهم انا برآء منكم ومما

تعبدون من دونه الله كفرنا بكم وبدا بيننا وبينكم العدواه والبغضاء ابداً حتى تؤمنوا بالله وحده﴾ .

واتــه : بەڕاســتی هەڵوێســتی ابراهیــم و ئیمانداردكــانی لەگەڵی بــوون بەرامبــەر قەومەكەیان نموونەیــەكی زۆر بــەرزو زینــدووە بــۆ ئێوەی ئوممــەتی محمــد (ﷺ) كاتێك بەقەومەكەیان ووت : ئێمــە بــەرین لــەئێودو حاشــاتان لێ دەكــەین و بەڕاســتان نازانین و پێتان ڕازینین و بــەر یــن لـەو خوایــە ناحەقانــەی ئێوە لەغەیری خودا دەیان پەرستن . بەكافرتان دەزانــین و دژایــەتی و ڕق و قین لەنێوانمان بەدەركەوت[٧] و دروست بوو بە بــەردەوامی تا ئەوكاتەی خوای گەورە بەتاك و تەنهایی دەپەرستن .

## مەرجی چوارەم

## ڕاستگۆیی و نیازپاكی ( الصدق و الإخلاص )

واتە : ئەم (لااله الاالله)یە بەڕاستگۆی و ئیخلاص دەری ببڕی و مەبەستت پێی ڕەزامەندی خودابێت .

---

(٧) بزانە چۆن خوای گەورە دژایەتی نێوان ابراهیم و قەومەكەی . بە بەدەر كەوت (بدا) باس كرد . كەواتــە نابێ دژایــەتی هــەر بــەدڵ و بەدزیــەوە بێت نیــلا لەهــەندێ حاڵەت نــەبێ انشاء الله لــە بەشــەكانی داهــاتووی ئــەم زنجیرە ئــەم حاڵەتانە دیاری دەكەین .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : (( مامن احد يشهد ان لااله الاالله وان محمد رسول الله صدقاً من قلبه الاحرمه على النار )) . (٨)

واتە : هيچ كەسێك نییە شايەتمانی بە لااله الاالله وان محمدا رسول الله دەهێنێت . بەڕاستگۆیی لەدڵی دەری دەبڕێت ئيلا خودا ئاگری دۆزەخەی لەسەر حەرام دەكات .

دەقی فەرموودەكە ئەوە دەگەیەنێ هەركەسێ بڵێ (لااله الاالله) بەڵام ڕاستگۆیانە دەری نەبڕێ لەدڵییەوە وەك دووڕووەكان كەهەر بەزمان دەریان دەبڕی . ئەوا خوای گەورە وەری ناگرێ . وەك ئەو حاكمە تاغوتانە لەبەردەم گەل و میللەت دەڵێن لااله الاالله بۆ ئەوەی خەڵكەكە هەڵخەڵەتێن واتێبگەن كەوا موسڵمانن . لەپشت پەردەش كوفرو شركەكانی خۆیان ئەنجام بدەن بەڵام بەم فەرموودەیە ڕوون دەبێتەوە كەوا ئەم شايەتمانە بەكەڵكیان نایەت . بەڵكو هەركافرو مورتەدو تاغووتن .

---

(٨) رواه البخاری .

## مەرجی پێنجەم

## نەمانی گومان ( انتفاء الشک )

واتــه ، نابــێ هیــچ گومــانێك دروســت بكــرێ لەڕاســتی و دروســتی ووشــەی (لاالــه الاالله) ومانــای (لاالــه الاالله) . ئەگــەرنا سوودی نابێ بۆ خاوەنەكەی .

پێغەمبــەر (ﷺ) دەفــەرموێ : (( شــاهێدی ئــەدەم بەلاالــه الاالله محمد رسول الله هیچ كەسێك نییه ئەم شایەتمانه بهێنێت و بمرێ لەسەری هیچ گومانێكی لێ ی نەبێ . ئیلا دەچێتــه بەهەشت )) .

## مەرجی شەشەم

## یەقین بوون لەڕاستیەکەی ( حصول الیقین فی حقه )

واتــه : دەبــێ بەیەقینــەوە ئیمــان هــەبێ بــه (لاالــه الاالله) وه یەقینت هەبێ لەڕاستی و دروستی مانای (لااله الاالله) . پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ((من یشهد لاالــه الاالله مستقیناً بها قلبه فبشره بالجنة)) .[٩]

---

(٩) رواه مسلم .

واتە : هەرکەسێ شایەتمانی بە لااله الاالله بهێنێت .
لەدڵیەوە یەقینی هەبێ لەڕاستیەکەی ئەوا موژدەی بەهەشتی پێ بدە .

## مەرجی حەوتەم

## خۆش ویستن (الحب)

واتە: دەبێ پێت خۆش بێت هیچ خوایەك نیە جگەلە الله وە خۆشەویستی ڕاستەقینەت تەنها بۆئەو خودایە بێت کە بەووشەی لااله الاالله مافی خوایەتی پێ ئەدەی بەتاك و تەنهایی وە بۆئەو کەسانە و ئەو شتانە بێت کە خودا خۆشی دەوێت چونکە خۆش ویستن پەرستنە . کەتۆش مافی پەرستراوی تەنها بەخودا ئەدەیت دەبێ . خۆشەویستیت تەنها بۆ ئەو خودایە بێت . خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ومن الناس من يتخذ من دون الله انداداً يحبونهم كحب الله والذين امنوا اشد حباً لله﴾ (البقرة :١٦٥)

واتە : (هەندێ لەخەڵکی هەندێ شت و هەندێ کەس دێنە ڕیزی خوای گەورە بەوەی خۆشیان دەوێت بەقەد خۆشەویستی

خـودا . وە ئیمـانداریش هـەموو خۆشەویسـتیان بـۆ خوایـە و خوایان زۆر زیـاتر خـۆش دەوێت لـەچاو خۆشەویستی کافرەکان بۆخواکانیان)

بزانە چۆن خوای گەورە ئـەو خەڵکانـەی بـەکافر زانـی کـە یـەکێکیان بەقـەد خـوا خـۆش دەوێـت . چ جـای ئـەو کەسـانەی سـەرکردەو سـەرۆکەکانیان لـەکافران و تاغووتـان لـەخودا خۆشتر دەوێت .

هـەروەها خـوای گـەورە دەفـەرموێ : ﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ (التوبة :٢٤)

(ابـن القیـم) (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت) لەتەفسـیری ئـەم ئایەتـەدا دەفـەرموێ : هەرکەسـێ گوێڕایـەڵی یـەکێك پێـش گوێڕایـەڵی خـواو پێغەمبـەر (ﷺ) خسـت یـان تـرس و ئومێـد و پشت پێ بەسـتنی یـەکێك لەوانـەی باسکران لـەم ئایەتـە پێـش ترسـان لـەخوا و ئومێـد بە خواو تـەوەکول کـردن بـەخوا یـان موعامەلـەی یـەکێك لەمانـەی پێـش موعامەلـەی خواخسـت ئەوکەسە لەو کەسانەیە کە خواو پێغەمبـەری لەهـەموو کەسێك

زیاتر خۆش ناوێت ئەگەر بەزمانیش وابڵێت . (واتە بڵێت خوا پێغەمبەرم (ﷺ) لەهەموو کەس زیاتر خۆش دەوێت) ئەمە درۆیە کە دەیکات و ڕاگەیاندنی شتێکە بەپێچەوانەی خۆی . هەروەها ئەگەر حوکمی یەکێکی پێش حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی خست . ئەوا ئەوکەسەی زیاتر خۆشی دەوێت لەخواو پێغەمبەر (ﷺ) . (١٠)

## مەرجی هەشتەم

## ڕازی بوون و مل کەچ کردنی تەواو

## (الرضى والتسلم والانقياد التام)

خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لا يجدوا في أنفسهم حرجا مما قضيت ويسلموا تسليما﴾ (النساء :٦٥)

واتە : سوێند بەخواکەت ئەی محمد ئیمان ناهێنن تاتۆ نەکەن بەحاکم لەنێوان خۆیان لەهەموو شتێك وە بەدڵ و بەزمان ڕازی بن و قبوڵی بکەن ئەو حوکمەی تۆ دەرتکردوە .

(١٠) (مدارج المساكين ١ / ١٠٠) .

لەمەوە دەزانين هەر كەسێ ڕازى نەبێت بە (لااله الاالله) ببێتە مەنهەج و پرۆگرامى لەژيانيدا وەملى كەچ نەكات بۆ ماناكەى ئەوا لەوكەسانە نىيە كە شاهيدى (لااله الاالله محمد رسول الله) يان هێناوە . ئەگەرچى بەزاريش دەرى بڕێت .

## مەرجى نۆيەم

## بەجێ گەياندنى پێويستيەكان بەكردەوە

## (العمل بلوازمها)

واتە : بەكردەوە (لااله الاالله) جێبەجێ بكرێت ئەويش بەجێبەجێ گەياندنى يەكخواپەرستى (التوحيد) و دوور كەوتنەوە لەهاوەڵ برياردان بۆ خوا (الشرك) چونكە ئيمان بريتيە لە (قول و عمل) واتە قسەو كردەوەيە ، وەخوى گەورە دەفەرمووێت : ﴿وما أمروا إلا ليعبدوا الله مخلصين له الدين حنفاء ويقيموا الصلوة ويؤتوا الزكاة وذلك دين القيمة﴾ (البينه : ٥)

واتە : (تەنها فەرمانيان پێ كراوە خوا بەتاك و بەتەنياى بپەرستن و ڕێگەى ڕاست بگرنە بەر ونوێژو زەكات ئەنجام بدەن (إبن كثير رحمه الله) دەفەرمووێت : زۆر لەزاناكان ئەم ئايەتە دەكەن بە بەلگە لەسەر ئەوەى كردوە مەرجە بۆ ڕاستى

ئيمان (محمـد بـن عبدالوهـاب رحمـه الله) دەفـەرمووێت : يـەكخوا پەرستى (التوحيد) بەدڵ و بەزمان و بەكردەوە دەكرێت ، ئەگەر يەكێك يەكخوا پەرستى بەجێ نەگەياند بەيەكێك لەم سێ هۆيـە ، ئەوا موسوڵمان نىيە .

كەواتە هەركەسێ بڵێت (لاإلـهإلاالله) لـە هـەموو ژيـانى قـەد بـەكردەوە جێبـەجێ نـەكردبێت ، بـەڵكو لەوانەيـە پێچەوانەشـى بكـات ، وەك ئـەوەى خۆشەويستى هـەبێت بـۆ كـافران ئـەوا ئـەم (لاإلهإلاالله)يە هيـچ سوودێكى پێ ناگەيەنێت .[١١]

## مەرجى دەيەم

## مردن لەسەر (لاإلهإلاالله) (الموافاة عليها)

واتــە ئەگــەر ووشــەى (لاإلــهإلاالله) دەربــڕى بەهــەموو مەرجەكانىيەوە دەبێت لەسەريشى بمرێت ، واتـە هـەتا دەمرێت هــەردەبێت لەســەر ئــەم بيروبــاوەڕ بێــت ، پێغەمبــەر (ﷺ)

---

(١١) لەبەشى دووەمى ئەم زنجيرديە ( . ) روونى دەكەينەوە كە چۆن ئيمان (قول و عمل)ە .

دەفەرموویت : ((مَامِن عبدٍ قال لا إله إلا الله ثم مات على ذلك إلا دَخَل الجنَة)) [١٢]

واتە هیچ بەندیەك نیە بلێت (لاإلەإلاالله) لەپاشان لەسەر ئەم (لاإلەإلاالله)یە بمرێ ئیللا دەچێتە بەهەشتەوە . چەمکی فەرموودکە ئەوە دەگەنێت هەرکەسێ لەسەر (لاإلەإلاالله) نەمرێت ناچێتە بەهەشتەوە .

کەواتە هەرکەسێ بلێت (لاإلەإلاالله) وە کوفر بکات بەوانەی جگە لەخوا دەپەرسترێن ، وشارەزا بوو بەمانی (لاإلەإلاالله) وە هیچ شك و گومانی لەڕاستی نەبوو وە یەقینی بەڕاستیەکەی هەبوو ، وە بەڕاستگۆیانە و بەدڵسۆزی ، ئەم ووشەیە لەدڵیەوە دەربڕی ، وە خۆشەویستی ئەم ووشەیە پێش هەموو خۆشەویستیەك خست ودپێی ڕازی بوو و ملی کەچ کرد بۆی وە ئیشی پێ کرد بە کردەوە وە لەسەر ئەم (لاإلەإلاالله)یە مرد ، ئیللا خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە .

دەبێ بەم شێوەیە هەموو فەرموودەکان لەسەر (لاإلەإلاالله) لێك بدەین ، ئەگەرنا ئەحەقمان نەوتووە .

---

(١٢) رواه مسلم

## چوارەم:

# دژە کانی (( لاإلەإلاالله ))

بێ گومان ، ئەو (١٠) مەرجەی باسمان کرد ئەگەر یەکێ بڵێت : (لاإلەإلاالله) وە پێچەوانەی یەکێ لەم (١٠) مەرجە بکات ، ئەوا کارێکی ئەنجام داوە کە دژ بە (لاإلەإلاالله)یە وە هەڵیدەوەشێنیتەوە . یاخود مەرجێك لەمەرجەکان بەجێ نەگەیەنێ .

وەك ئەوەی نەزانێ ماناى (لاإلەإلاالله) چىیە .

یاخود هاوەڵ بۆ خودا بڕیار بدات ، چونکە ئەمە دژى دڵسۆزى و ئیخلاصیە بۆ خوا یان دوو ڕووى بنوێنێ ، ئەمەش دژى ڕاست گۆییە ، یان شك و گومان لە ڕاستى (لاإلەإلاالله) هەبوو ئەمەش دژى یەقینە بە ماناى (لاإلەإلاالله) ، وەیان بەکردەوە نەیسەلمێنێت یان لەسەر ڕێبازى (لاإلەإلاالله) نەڕۆیشت یان کافرانو دژمانی (لاإلەإلاالله)ی خۆش و یست و وەلائی هەبوو بۆیان یان خۆی بەرى نەدەکرد لێیان و بەکافرى نەدزانێت یان دژایەتی نەدەکردن و ڕقی لێیان نەبوو یان ملی کەچ نەدەکرد بۆ حوکمەکانی خوداو حوکمی بەغەیرى قورئان دەکرد .

ئەمانە هەمووی هەڵوەشێنەرەوەن بۆ (لاإلەإلاالله) ، جا هەرکەسێ بڵێ : (لاإلەإلاالله) و یەکێ لەم هەڵوەشێنەرانەی تیابێت ئەوا دەربڕینی لااله الاالله بەکەڵکی نایەت بەڵکو هەر کافرە ، ئەگەر هیچ عوزرێکی شەرعی نەبێت بەگشتی هەموو کردەوەیەك کوفر و شرکی گەورە (اکبر) بێت ، ئەوا دژ بە (لاإلەإلاالله)یە وە هەڵوەشێنەرەوەیەتی ، واتە : (یضاد لاإلە إلا الله و ینقاضه کل کفر و شرك أکبر) .

# چەند تێبینییەك و پرسیارێك

**١- ئایا ئەگەر یەکێ لەکافرەکان لە گەرمەی شەڕدا ووتی ( لاإلەإلاالله ) دەبێ بکوژرێت ؟**

ئەو کافرەی لەگەرمی شەڕدا ، دەڵێت : (لاإلەإلاالله) بەهیچ شێوەیەك دروست نییە بکوژرێت ، بەڵکو دەبێ لێی وەربگیرێ و کوشتنی لەسەر لابدرێت ، هەتا سەیر دەکرێت ، واجبەکانی تری ئیسلام بەجێ دەگەیەنێ یان نا ئەگەر بەجێی گەیاند ئەوا بە موسڵمان حیسان دەکرێت و حوکمی موسوڵمانی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت ، بەڵام ئەگەر جێبەجێی نەکرد ، ئەوا ئەم (لاإلەإلاالله)یەی لێ وەرناگیرێ و بەموسڵمان نازانرێ وە حوکمی کافری بەسەردا جێبەجێ دەکرێ .

بەلگەش لەسەر ئەم زۆرە لەوانە : ڕووداوەكەی ئوسامەی كەوڕی زەید ، كاتێك لەشەڕدا پیاوێكی كوشت دوای ئەوەی ووتبووی (لاإلەإلاالله) ، پاشان هات لەلای پیغەمبەر (ﷺ)ی باسكرد ، پێغەمبەر (ﷺ) ، پێی فەرموو : ووتی (لاإلەإلاالله) و هەر كوشتت ، ووتی ئاخر ئەو لەترسی چەكەكەم ووتی (لاإلەإلاالله) ، پێغەمبەر پێی فەرموو : (( أفلا شققت قلبه )) .. واتە: ئایا دڵی ئەو كەسەت شەق كرد بوو ؟ تا بزانی لەترسی چەكەكەت وای ووتووە یان لەبەر خوا ووتوویەتی .[١٣]

ئیمامی نووی دەفەرموێت :[١٤] [وقوله (ﷺ) : (( أفلا شققت عن قلبه )) فيه دليل للقاعدة المعروفة في الفقه و الأصول أن الأحكام يعمل فيها بالظواهر و الله يتولى السرائر] .

واتە : ئەم فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) (( أفلا شققت عن قلبه )) بەلگەیە لەسەر ڕاستی ئەو بنمایەی كە لە فیقە و ئوصول ئیشی پێ دەكرێت . كە دەفەرمووێ : حوكمدان بەسەر كەسان بەگوێرەی ظاهری كەسەكەیە وە نهێنی دڵەكانیش خودا خۆی لێی دەكۆڵێتەوە )) .

---

(١٣) ئەم فەرموودەیە موسلم ڕیوایەتی دەكات .

(١٤) شرح صحيح مسلم (١٠٧/٢) .

جا هەر كەسێ بەم شێوەیە بڵێت (لاالە الاالله) دەبێ لێ ی وەربگرین چونكە بە ظاهیرەكەی وانیشان دەدات كە دەیەوێت بێتەناو ئیسلام . ئێمەی موسڵمانیش حوكم بەظاهیر دەدەین و فەرمانمان پێ نەكراوە دڵەكان شەق بكەین تا بزانین خەڵكی بەڕاستی ئیمانیان هێناوە یان لەبەر شتێكیتر . هەروەها بەهیچ شێوەیەك نابێ لەم حاڵەتە گومان بەكار بهێندرێت وەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) گومانەكەی اسامەی وەرنەگرت لەكاتێكیشدا لە گەرمەی شەڕدا بوون و شمشێرەكەی لەسەر بەرز كردبۆیەوە . ئەگەر بەگومان بێت كەسێ لەم حاڵەتە بڵێت (لاالە الاالله) دەڵێین ئیلا لەترسا بووە . بەڵام ئەمە قبوڵ ناكرێ و دەبێ حوكم بەظاهری خەڵكەكە بدەین .[١٥]

**٢- ئایا هەر كەسێ بڵێت لاالە الاالله . ئەبێ بە موسڵمان؟**

بەڵێ دێتە ناو ئیسلام بە مەرجی ئەوەی بەردەوام بێت لەسەر ئەم لاالە الاالله یە و كارێك نەكات دژی ئەم ووشەیە بێت و واجبەكانی تری ئیسلامیش بەجێ بگەیەنێ .

---

(١٥) ئەمە ئەگەر كافرە كە كافری ئەصڵی (كافر اصلی) بوو بەڵام ئەگەر هەڵگێراوە بوو (مرتد) . ئەوا لەگەڵ ووتنی (لاالە الاالله) یەكەش دەبێ پەشیمان ببێتەوە لەوشتەی كە بەهۆیەوە لەئیسلام دەرچووە . وەك ئ [illegible]لەبەر باوەڕ نە[illegible] بە (نوێژ) هەڵگەڕابێتەوە لەئیسلام ئەوا لەگەڵ ووتنی شایەتیەكە . دەبێ دان بە فەرزیەتی (نوێژ)یش دابنێت .

بەگشتی دێتە ناو ئیسلام . بەڵام ئەم ئیسلامەتیە بۆی بەردەوام نابێ ئەگەر دەیتوانی مەرج و پێویستیەکانی لاالـه الاالله جێبەجێ بکات . بەڵام جێبەجێی نەدەکرد . بەڵکو ئەم کەسە لەم حاڵەتە بە هەڵگەڕاوە (مرتد) لەقەڵەم ئەدرێت .

**٣- کێ عوزرو بیانووی هەیە لەجێ بەجێ نەکردنی مەرجەکانی ( لاالـه الاالله ):**

وەك ووتمان دەبێ هەموو مەرجەکانی لاالـه الاالله و پێویستیەکانی جێبەجێ بکرێت . ئەگەر نا لەخاوەنەکەی قبووڵ ناکرێ بەڵام ئەگەر عوزری شەرعی هەبوو نەیدەتوانی یەکێ لەمەرجەکانی جێبەجێ بکات یان هەموو مەرجەکانی جێبەجێ بکات . ئەوا هیچی لەسەر نییە .

عوزری شەر عیش ئەوەیە کە یەکێ نەتوانێ فێری عیلمە شەر عیەکان بێت کە بەهۆیە بتوانێ پێداویستیەکانی لاالـه الا الله جێبەجێ بکات بە لاّم گەر توانای هەبوو . هەر بەخۆی خۆی فێر نەدەکرد لەبەر دونیا یان مصلحەت یان هەرشتێکی تر ئەوا بەعوزر ناژمێردرێت .

مەسەلەی (عوزری شەرعی) بابەتێکی فراوانە . لێرە ناتوانین بەووردی باسی لێوە بکەین بەڵام انشاء الله لەزنجیرەکانی

داهاتووە بەشێك تایبەت دەکەین بەمەسەلەی (عوزری شەرعی و حوجە بەسەرا کردن) (العذر بالجهل وقيام الحجة)

لەکۆتایی هیوادارین بابەتەکە حەقی خۆیمان پێدابێت . خوداش لەکەم و کورپەکانمان خۆش بێت . لەوانەشە زۆر لایەن هەبێت جوان ڕوون نەکرابێتەوە انشاء الله هەموو ڕوون دەکرێتەوە لەزنجیرەکانی داهاتووە .

سبحان ربك رب العزة عما يصفون

وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين

**چاوەڕوانی زنجیرەی داهاتوو بن**

**ـیمان**

**لەلای ئەهلی سوننەو جەماعە**

# چاوەڕێی ئەم بەرهەمانەش بن

١- چۆن خەونەکانت لێك ئەدەیتەوە لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت .

٢- پەرتووکی(تاوانە گەورەکان)ئیمامی الذهبي

٣- کوفرو ئیمان لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەو فتوای زانایان.

٤- ئەو هۆیانەی خۆش ویستنی خوا لەدڵ دروست دەکەن (ابن القیم) .

٥- (شرح العقیدة الطحاویة) بە کوردی لە (٣٠٠) پرسیارو وەڵامدا.

٦- هۆیەکانی تەنگ بوونی دڵ لەگەڵ دیاری کردنی هۆکارەکانی فراوان بوونی سنگ (ابن القیم) .

٧- (٥٢) پرسیار دەربارەی ئەحکامی حەیزو زەیستانی لە (نوێژ ، ڕۆژوو ، حەج) عثیمین .

٨- حیجاب . بەڵگەکانی واجب بوونی . مەرجەکانی ڕەتدانەوەی گومانەکان . لەگەڵ هەندێ لە فتوای زانایان لەبارەی ئەحکامی جل و بەرگی ئافرەتی موسڵمان .

٩- دوعا . فەزڵ و ئادابی .

١٠- ئادابەکانی خوێنـدەوی قورئـان لەگـەڵ هـەندێ فتـوای زانایـان لەم بارەیەوە .

١١- (٤٠) ئامۆژگاری بۆ خوشکانی پەیامەکەم .

١٢- حوکمی ساحیرو سیحر

١٣- ئەو مەترسیانەی هەڕەشە لەماڵەکان دەکەن .

١٤- زنجیرەیەك بۆ یەکخوا پەرستان

١- وشـەی لاالـه الاالله . ماناکـەی پایـەکانی . مەرجـەکانی . دژەکانی .

٢- ئیمان لەلای ئەهلی سوننەو جەماعە (٢)

٣- کوفر لەلای ئەهلی سوننەو جەماعە (٣)

٤- هەڵگەڕانەو لەدین و هەڵگەڕاوە (الردة والمرتد) (٤)

٥- حوکـم نـەکردن بـەقورئان . لەڕوانگـەی ئـەهلی سـوننەو جەماعە (٥)

٦- بیانوو هێنانەوە بە نەزانین (العذر بالجهل) (٦)

٢١- (٤٠٠) فتـوای ئیسـلامی دەربـارەی سـەرجەم بوارەکـانی ئـایین بەگشتی .